

# یادی خوا و دوعـــاكان

## له (قورئان و سوننه‌ت)دا




ئاماده‌كردنی
عبدالله عبدالرحمن



رمضان ١٤٢٩ ٢٠٠٨

# یادی خوا

# دوعــاکان

## له (قورئان و سوننەت)دا

ئامادە کردنی:

عبدالله عبدالرحمن

رمضان ١٤٢٩ ٢٠٠٨

ناوی کتێب: یادی خوا و دوعاکان له (قورئان و سوننه‌ت) دا

بابه‌ت: یاد و پاڕانه‌وه

نووسه‌ر: عبدالله عبدالرحمن

شوێنی چاپ: هه‌ولێر به‌رتوکخانه‌ی حاجی قادری کۆیی

سالی چاپ: ٢٠٠٨

## پێشەکـــــی..

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمـدلله والـصلاة والـسلام علـى رسـول الله وعلـى آلـه وصحبه الكرام.

مرۆڤ ئەو بوونەوەرە بێ قەرارەیە کە تاوێك ناتوانێت ئارام بگرێت، تاکو شوێنگەیەکی ئارامی وەدەست نەکەوێت، تاکە مەنزلگای ئەو ئارامشەش دڵەو دڵیش کاتێك ئارامە کە سەرقاڵی یادی خوابێت ﴿أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ﴾، هەر بۆیە پێداویستی ژیانێکی ئـارام دێراوکردنـی دڵـه بـە یاد و زیکری خوا.

یادی خوای گەورە سەرجەم پەرستن (عبادة)ەکانی لە هەگبەدایــە ﴿أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِيٓ﴾، پاڕانــەوەو دوعــاو نزاکان پەرستنە (الـدعاء هـو العبـادة) کـە لـەزۆر جێگـەی قورئان و فەرموودەدا ئاماژەی پێ کراوە.

بەجێگەیانـدنی نـزاو پاڕانـەوەكان وەك پرۆگرامێـك لەژیاندا هۆكاری هەمیشە ئاگادارییـە بـە خـوا لەسـەرجەم كاتەكانی (خەو، ئاگایی، نـان خـواردن..هتـد)دا بـەجۆرێك سەرجەم كاتەكان دەبێتە بەندایەتی.

نزاو دوعای سـەر زاری پێغەمبـەران و پیاوچاكان كـە لەقورئاندا هاتووەو ئەو یادو دوعایانەی كە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە دووبـارەی كردوونەتـەوەو لەشـێوەی فـەرموودەدا بەئێمـە گەشـتووە وە كاریگـەری خـۆی هـەبووە چاكترین دەربڕینانێكن كە شـایەنی خوێنـدن بـن و وەكـو نـزاو یـاد (ذكر) بەكار بهێنـرێت.

ئــەم پــەڕاوەی بەردەســتتان هەوڵێكــە بــە ئامــانجی چاككردن و بەرچاو ڕوونـی خوێنەرانـی و ئاشناكردنیان بە دروستترین ئەو نزاو دوعایانەی كە لەقورئان و فەرموودە ڕاستەكاندا هـاتووە، كـەم و كورتییـەكانی دەگەڕێتـەوە بـۆ سـیفەتی كـەمو كـورتی مرۆڤیمـان و هـەر بۆیـە هـەموو

هەڵەیــەك و کەمتەرخەمییــەك بــۆ ئێمــە دەگەڕێتــەوە، چاکەو دروستیشی چاکەو نیعمەت و ڕەحمەتی خوایە کـە دەرفەتی ئەم خزمەتەی بەدینەکەی پێـداوین، هـەر بۆیـە داوای لێخۆش بوون لە خوا دەکەین، ئێوەش بمانبورن.

خوای گەورە لێمان خۆش بێت و بە بەهەشت شادمان بکات

بەندەی هەژار بە ڕەحمەتی خوا





## الذكر (يادى خوا)

یادی خوا پەیوەندی نێوان خوای گەورەو بەندەکانیەتی. درگایەکی گەورەی کراوەیە لەنێوان خوای گەورەو بەندەکانی، گەر بەندەکان دای نەخەن لەسەر خۆیان بە غەفلەت. رۆحی هەموو کردارێکی چاکەیە. بەبێ یادی خوا کردارەکان وەك جەستەیەکی بێ گیانە.

توێشووی دڵ و ئاوەدانی جەستەو لاشەیە، چەکێکە بۆ لەناوبردنی رێگرەکان، دەرمانی دەردو نەخۆشیەکانە، لابەرو ئاسانکاری نارەحەتی و ناخۆشیەکانی ژیانە.

دانیشتن و کۆڕ و کۆمەڵ بۆ یادی خوا بریتییە لە زانینی (حەڵاڵ و حەرام -چۆن نوێژ دەکەی- چۆن بەرۆژوو ئەبی - چۆنیەتی کڕین و فرۆشتن- دەستنوێژ و شتی تر) بە ووتەی عطای کوڕی رباح (سەعیدی کوڕی جوبەیر) (تابعی یەو قوتابی ابن عباسە) کە دەفەرموێ: یادی خوا (بەجێ هێنانی



فرمانەکانی خوایەو گوێڕایەڵی یە بۆی، جا هەرکەسێ فرمانی خوا بەجێ نەهێنێ با زۆر قورئان بخوێنێ و تەسبیحات بکات ئەوا یادی خوای نەکردووە).

## چەند ئایەتێك باس لە یاد (ذکر)ی خوا دەکەن

١-﴿ إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥۚ ﴾.[١]

٢- ﴿فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ﴾.[٢]

٣- ﴿ٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكۡرٗا كَثِيرٗا ﴾.[٣]

٤- ﴿وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ﴾.[٤]

---

١ سورة فاطر (١٠)

٢ البقرة (١٥٢)

٣ الأحزاب (٤١)

٤ الأحزاب (٣٥)





٥- ﴿ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ﴾ .[١]

٦- ﴿إِذَا لَقِيتُمۡ فِئَةً فَٱثۡبُتُواْ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا﴾ .[٢]

٧- ﴿فَإِذَا قَضَيۡتُم مَّنَٰسِكَكُمۡ فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَذِكۡرِكُمۡ ءَابَآءَكُمۡ أَوۡ أَشَدَّ ذِكۡرًاۗ﴾ .[٣]

٨- ﴿رِجَالٞ لَّا تُلۡهِيهِمۡ تِجَٰرَةٞ وَلَا بَيۡعٌ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ﴾ .[٤]

٩- ﴿لَا تُلۡهِكُمۡ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ﴾ .[٥]

---

١ آل عمران (١٩١)

٢ الأنفال (٤٥)

٣ البقرة (٢٠٠)

٤ النور (٣٧)

٥ المنافقون (٩)





١٠-﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ﴾ .[١]

١١-﴿أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ﴾ .[٢]

١ الأعراف (٢٠٥)

٢ الرعد (٢٨)

## هەندێ لەو فەرمودانەی کە باسی یادی خوا دەکات

١ -((سبق المُفرَّدُون. قالوا: وما المُفرَّدُون يارسول الله؟ قال: الذَّاكرون الله كثيراً والذَّاكِرَات)).[١]

٢-((مَثَلُ الَّذي يَذكُرُ رَبَّهُ والَّذي لا يَذكُرُ رَبَّهُ، مَثَلُ الحَيِّ والمَيِّتِ)).[٢]

٣-((من قَعَدَ مَقْعَداً لم يذكر الله تعالى فيه كانتْ مِنَ الله تِرَةٌ، وَمَن اضطجعَ مَضْجَعاً لاَ يذكُرُ الله تعالى فيه كانتْ عليه مِن الله تِرَةٌ)).[٣]

٤-((قال رجل: يارسول الله إن شرائع الإسلام قد كَثُرت عَلَيَّ، فأخبرني بشيء أتشبَّث به: قال: لا يَزالُ لِسانُكَ رطْباً مِنْ ذِكْرِ اللهِ تعالى)).[٤]

٥-((إن لله ملائكة يطوفون في الطريق يلتمسون أهل الذكر)).[٥]

٦-(قال الله) أنا معَ عبدى ما ذكرني، وتحركت بى شفتاه).[٦]

٧-((ما من قوم يقومون من مجلس لا يذكرونَ الله فيه، إلا قاموا من مثل جيفة حمار، وكان عليهم حسرة يوم القيامة)).[٧]

---

١ رواه مسلم

٢ بخاري

٣ صحيح ابوداود، احمد، الحاكم

٤ الترمذي حديث حسن احمد، ابن ماجه صححه الالباني في الكلم الطيب

٥ بخاري و مسلم

٦ حديث قدسي بخاري احمد وصححه الألباني في جامع الصحيح (١٩٠٦)

٧ الصحيحة ٧٧





## سوودەکانی یادی خوا

١-ڕیسواکردن و دوورخستنەوەی شەیتان لە مرۆڤ.

٢-دەبێتە هۆی ڕەزامەندی پەروەردگار.

٣-ڕەوینەرەوەی پەژارەی دڵ و بەخشینی خۆشی و چالاکی یە پێ ی.

٤-دڵ و جەستە بەهێز دەکات.

٥-هۆکارێکە بۆ زیادبوونی ڕۆزی (رزق).

٦-ڕێز و خۆشی ئەبەخشێ بە مرۆڤ.

٧-دەبێتە هۆی زیادبوونی خۆشەویستی خوا لەدڵدا و مرۆڤ بەختەوەر و شادومان دەکات.

٨-مرۆڤ دەگەیەنێ بە قۆناغی (إحسان) لە پەرستن دا کەهەست بە چاودێری خوا دەکات لەسەری.

٩-دروستکردنی هەستی گەڕانەوە (إنابة والرجوع)ی بەردەوام لە مرۆڤدا بۆلای پەروەردگار.

١٠-هەستکردن بە نزیکی لە خواوە بە ئەندازەی ئەو یادەی دەیکا، چەندە بێ ئاگابێت ئەوەندەش دوورە لە خوا.





١١- كرانەوەی دەرگای لێخۆشبوونی خودایی.
١٢-پابەندیی و گەورەیی پەروەدگار لەدڵیدا زیاد دەبێت (الهيبة والعظمة).
١٣-دەبێتە هۆی یادکردنی بەندە لەلایەن پەروەردگارەوە (اذكروني اذكركُم).
١٤-خۆراكی دڵ و گیانە.
١٥-(استغفار و یادی خوا) دڵ لە ژەنگی (بێ ئاگایی و تاوان) دائەماڵێ.
١٦-تاوان و هەڵەكانی بەندە هەڵدەوەرێنێ.
١٧- یادی خوا نێوان مرۆڤ و خوای گەورە ئاوەدان ئەكاتەوە.
١٨-گەر بەیادی خوا نزیك بینەوە لە خوا لەكاتی خۆشی و ئاساییدا، ئەوا خوای گەورە لەكاتی ناخۆشی و ناهەمواریدا بەهانامانەوە دێ.
١٩-لەسزای خوا رزگارمان دەكات.
٢٠-هۆیەكە بۆ دابارینی دڵنیایی و میهرەبانیی خوایی لەئەنجامی دەورەدانمان بە فریشتەكانی ((حفتهم الملائكة و غشيهم الرحمة)).[١]

---

١ حديث مسلم

٢١-هۆكارێكە بۆ سەرقاڵبوونی زمان و دووربوونی لە غەیبەت و باس كردنی خەڵكی و درۆو قسەی ناڕەواو نادروست.

٢٢-دەبێتە هۆی بەختەوەری خۆی و هاونشینانی و بەپێچەوانەشەوە.

٢٣-دڵنیابوون لەپەشیمانی دەرنەبڕین و ئاخ هەڵنەكێشان لە ڕۆژی دوایی دا لەو ڕابردووەی كە هەیبووە (الحسرة) (والندامة).

٢٤-دەبێتە یەكێك لەوانەی لەژێر ئەو سێبەرەدا دەبن كە پەروەردگار تایبەتی كردووە بۆ هەندێك لەبەندەكانی لەڕۆژی دوایی دا .

٢٥-ئاسانترین و چاكترین جۆری پەرستنی خودایە.

٢٦-لەو كەسانەی كە داواكاری بەخششەكانی خوداین زیاتری بەردەكەوێت.

((من شغله ذكري عن مسألتي أعطيته أفضل ما أعطي السائلين)). [١]

---

١ بخاری



٢٧-یادی پەروەردگار بەرامبەرە بەچاندن و بەخشینی ڕووەکێك لە بەهەشتدا لەلایەن پەروەردگارەوە.

((من قال سبحان الله وبحمده غرست له نخلة في الجنة)).[١]

٢٨-یادی خوا کارو فرمانەکانی بەندە ئاسان دەکات و کاری لەبەر دەڕوات، لەکاتی سەرجێگادا، لەبازاڕ، لە دانیشتنیدا، لەسەفەرکردنیدا، لە کاتی نەخۆشی و تەندروستی دا.

٢٩-((یادی پەروەردگار نورە لە دونیادا، لەگۆڕدا، لە ڕۆژی مەحشەر و لەسەر صراطدا)).[٢] (واجعلنی نورا)

٣٠-یادی خوا درەختێکی بەردارە بە زانست.

٣١-((یادی خوا پلەی جیهادی هەیە)).[٣]

٣٢-یادی خوا چڵەپۆپەی سوپاسگوزاری خوایە.

٣٣-ڕەقی دڵ (قساوة القلب) لادەبات.

---

١ اخرجه الترمذي وصححه الألباني

٢ بخاری

٣ ترمذی صحیح

٣٤-شفايه بۆ دڵ لەنەخۆشیەکانی وەك بێ ئاگایی و لەبیرچوونەوەو خۆشەویستی دونیا و.. هتد.

٣٥-یادی خوا هۆکاری بەدەستهێنانی خۆشەویستی و سەرخستنی خوایی یە هەرچۆن بێ ئاگایی پەروەردگار مایەی لەدەستدانی خۆشەویستی و پشتیوانی خوایی یە.

٣٦-بەدیهێنەری رِۆزیی و بەخشەکانی خوایەو دوورخەرەوەی تورِەیی و نارِەزامەندی یەکانیەتی.

٣٧-بە یادی خوا بەندە دەکەوێتە بەر درورود(صلاوات)ی پەروەردگار و فریشتەکانی.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ...﴾.[1]

---

[1] الأحزاب (٤١-٤٣)

٣٨-باخچەیەکی بەهەشتە.[١]

((إذا مررتم برياض الجنة فارتعوا، وما رياض الجنة؟ قال: حلق الذكر))

٣٩-((خوای گەورە شانازی بە بەندە یادا‌وەرەکانی خۆیەوە دەکات لای فریشتەکانی)).[٢]

٤٠-کردار و پەرستشەکانی مرۆڤ هۆکاری یاداوەری پەروەردگارە.

﴿أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ..﴾.[٣]

٤١-بەردەوامی یادی خوا جێگرەوەی زۆربەی پەرستشە سوننەتەکانە (تطوع) (پەرستشە جەستییەکان یاخود ماڵییەکان).

((ان فقراء المهاجرين أتوا رسول الله فقالوا -ذهب أهل الدثور- بالدرجات العلى، والنعيم المقيم. يصلون كما نصلي، ويصومون كما نصوم، ولهم فضل أموال يحبون بها، ويعتمرون،

---

١ (رياض الجنة) صحيحة (٢٥٦٢)

٢ (حديث صحيح مسلم)

٣ طه (١٤)



ويجاهدون، فقال: ألا أعلمكم شيئاً تدركون به من سبقكم، وتسبقون به من بعدكم، ولا يكون أحد أفضل منكم إلا من صنع مثل صنعتم؟ قالوا: بلى يا رسول الله قال تسبحون، وتحمدون، وتكبرون خلف كل صلاة..)).[1]

٤٢-گەورەترین یارمەتیدەر و پاڵپشتە بۆ بەجێهێنانی فرمانەکانی خوا، چونکە فەرمانەکانی خوا خۆشەویست ئەکات لای مرۆڤ، بەمەش بەندە چێژی لێوەردەگرێ و ئاسان دەبێت لەسەری.

٤٣-یادی خوا مرۆڤ بەهێزدەکات و بەئەنجام گەیاندنی کارەکان لەبەردەمیدا ئاسان دەکات.

٤٤-یادی خوا مرۆڤ بەهێز دەکات، کاتێك کە ئەو کارە بەجێ دەهێنێ و یادی خوا دەکات زۆر بە ئاسانی دێت بەدەستیەوە.

((کاتێ فاطمە ی کچی پێغەمبەر ﷺ هات بۆلای و داوای خزمەتکارێکی کرد ئەویش فەرموی پێش خەوتن (سبحان الله والحمدلله والله اکبر) بکە باشترە بۆت لە خزمەتکار)).[2]

---

١ متفق عليه

٢ متفق عليه

٤٥-فریشتەکان داوای لێخۆشبوون بۆ بەندەی یادادەر دەکەن هەروەك چۆن داوای لێخۆشبوون بۆ ئەو کەسە دەکەن کە پەشیمانەو تۆبە ئەکات.

٤٦-زۆریی یادی خوا بە دورت ئەکات لە دوڕویی و نیفاق، چونکە سیفاتی موونافیقەکانە ﴿وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلاً..﴾.[1]

٤٧-بەردەوامی یادی خوا لەڕێگە، لەماڵدا، لەبازاڕ، لە سەفەردا، لەهەر شوێنێکدا ئەبێتە شایەت بۆ مرۆڤ لەڕۆژی دوایی.

﴿يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا﴾.[2]

((أتدرون ما أخبارها؟ قالوا: الله ورسوله أعلم قال: أخبارها أن تشهد على كل عبد او أمة بما عمل على ظهرها تقول: عمل كذا وكذا، كذا وكذا)).[3]

١ النساء (١٤٢)

٢ الزلزلة (٤)

٣ الترمذي قال حديث صحيح





٤٨-پاداشت و بەخشـشی بەنـدەی یـاداوەر لـەیادکردنەوەکەیـدا بەرامبەر ناکرێت لەگەڵ هیچ جۆرە بەخششێکی تری کردارەکانیدا. ((لأن أقول: سبحان والحمدلله ولا إله إلا الله والله أكبر، أحبُّ إليَّ مما طلعت عليه الشمس)).[1]

٤٩-بەردەوامی لەیادی پەروەردگاردا هۆکارێکە بـۆ لـەیاد نەچوونەوەی بەردەوامی پەروەردگار کە هۆکـاری خراپـی و نادروستی مرۆڤە.

﴿وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ۚ﴾.[2]

٥٠-بەرێزترین کەس لای خوا لـە خواپەرستان ئەو کەسـەیە کە بەردەوام زمانی پاراوە بەیادی خوا. ((لايزال لسانك رطب بذكرالله)).[3]

---

١ رواه مسلم

٢ الحشر (١٩)

٣ صحيح جامع صححه

## ئەوانەی (یادی خوا) ئەکەن

١-پێغەمبەر ﷺ گەورەو پێشرەوی یاداوەرانی پەروەردگارە.

(كان رسول الله يذكر الله تعالى على كل أحيانه).[١]

پێغەمبەر یادی خوای کردووە لە هەموو کاتەکانیدا لەکاتی دەستنوێژی دا بوبێ یان لەباری جەنابەتدا بوبێ، هەمیشە یادی خوای کردووە.

٢-فریشتەکانی خوا ﴿يُسَبِّحُونَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ لَا يَفۡتُرُونَ﴾.[٢]

٣-دیاردە کەونیەکان:

أ-ئاسمانەکان و زەوی ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾.[٣]

﴿تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّ﴾.[٤]

---

١ رواه مسلم

٢ الأنبياء (٢٠)

٣ الجمعة (١)

٤ الإسراء (٤٤)



ب-شاخ و چیاكان ﴿وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ﴾.[1]

((مامِن مُلبّ يُلبِّي إلاّ لبّى ما عن يمينه وشماله من حَجَرٍ أو شجرٍ أو قَدَرٍ حتى تنقطع الأرض من ههنا وههنا)).[2]

ج-هەورە بروسكە ﴿وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعْدُ بِحَمْدِهِۦ ..﴾.[3]

٤-خواردن:

ابن مسعود دەڵێت:

((ولقد كنا نسمعُ تسبيح الطعام وهو يؤكل)).[4]

ابن حجر ئەڵێ: ئەمە لەسەردەمی پێغەمبەردا بووە.

---

١ الأنبياء (٧٩)

٢ صحيح ابن ماجة. والاكم وصححه الألباني الصحيحة (٢٣٦٣)

٣ الرعد (١٣)

٤ بخاری

٥-جنۆكه:

((لقد قرأتها على الجنّ ليلة الجنّ فكانوا أحسن مردوداً منكم، كلما آتين على قوله ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ قالوا: لا شيء من نِعَمِك ربنا نُكَذِّب، فلك الحمدُ)).[1]

٦-زیندەوەرەكان:

أ-نەهەنگ و ماسی دەریاكان:

((إنه ليستغفِرُ للعالم مَن في السموات ومن في الأرض حتى الحيتان في البحر)).[2]

ب-مێروو:

((...حتى النملة في جُحرها، وحتى الحوت ليُصلون على مُعلّم الناسِ الخير)).[3]

---

١ صحح رواه الترمذي صححه الألباني صحيحة (٢٦٢٤)

٢ صحيح ابن ماجه صحيحة (١٩٥)

٣ رواه الترمذي صحيحة (٢١٦١)

ج–پەلەوەر و باڵندە

﴿وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ..﴾.[1]

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلطَّيْرُ صَٰٓفَّٰتٍۖ كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسْبِيحَهُۥ﴾.[2]

## کاری ئەندامەکانی لەش و چەند نموونەیەك بۆ یادی خوا

١–زمان: هەموو ئەو دەربڕینانەی لە دەم دەردەچن بەشێوازی وتە کە هۆکاری نزیك خستنەوەن لە خوا وەك: لا إله إلا الله، سبحان الله، الله أكبر، خوێندنی قورئان، فرمان کردن بە چاکەو بەرهەڵستی لە خراپە، خوێندنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا، خوێندنی زانیاری.

١ الأنبياء (٧٩)

٢ النور (٤١)

٢-دڵ: بریتی یە لە بیرکردنەوەو ترسان و داواکردن بە نیازی لێخۆشبوونی خوا بە ناوو سیفاتە جوانەکانی، فەرمان وحوکمەکانی، کردارو ئایەت و نیعمەتەکانی.

- یاداوەری بە ڕۆح:- ((خۆبەدەستەوەدان و ڕازیبوون لە خوا)).[1]

٣-لەش ولار: هەر کردارێك نزیکت بکاتەوە لە خوا:

- پەرستن و یادەوەری خوا بە چاو:- گریانە.
- پەرستن و یاداوەری خوا بە گوێ:- گوێگرتنە وگوێ ڕایەڵی یە.
- یاداوەری خوا بە دەست:- بەخشین و هاوکاری کردنە.
- یاداوەری خوا بە جەستە:- هەر کردارێك نزیکت بکاتەوە لە خوا وەك بەوەفایی و ئەمەکداری و نوێژ- رکوع-سجود-حەج.

١ فتح الباري (١١ ٢١٢-٢١٣) شرح صحيح بخاري





## ڕیزبەندی جۆرەکانی یادی خوا

١-خوێندنی قورئان.

﴿صٓ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِی ٱلذِّكۡرِ﴾

((خيركم من تعلم القرآن وعلّمَهُ)).[1]

٢-یاد و بەرز ڕاگرتنی ناوو سیفاتەکانی خـواو دوورگرتنـی لەهەر شتێ شایەن بەگەورەیی ئەو نەبێت (سبحان الله).

٣-(حمد، ثنـاء، مجـد) (أحكـام أسمائـه وصِـفَاتِه) بلـێ (خـوا بیسەری دەنگەکانمانە) (خوا چاوی لە جوڵەمانە) خوا هیچی لێ ناشارێتەوە، خوا لە هەموو کەسوکار بەمیهرەبانترە..)

(ثناء، مجد) پیاهەڵدان بە پەروەردگاردا و ڕێزلێنانی بەوشێوەی شایەن بەخۆی بێت و ڕەزامەندبێ لەسـەری و پێغەمبـەر ﷺ دیاری کردبێت، بـێ لادان و لەکارخـستن لــە مانـاو وێنـە پێداندا.

---

[1] بخاری



٤-یاد هێنانەوەی فەرمان و قەدەغەکانی کە دیاری کراوە لە قورئان و فەرموودەکاندا.

٥-یادهێنانەوەی پەیامەکەی و چوون بەدەم داواکاریەکانیەوە لەدەست هەڵگرتن لەسەرجەم ئەو شتانەی جێگای ڕەزامەندی خوا نین.

٦-باسکردن و یادخستنەوەی بەخشش و نیعمەتە نەبڕاوەکانی.

٧-پاڕانەوەو نزاو داوای لێخۆشبوون.

٨-بەیاد هێنانەوەی نیعمـەتی چـاودێری (الرعایـة) چـاودێری خوایی بۆ بەندەکانی کە هەمیشە پارێزگاریی بەندەکانی دەکات لەهەر زیان و مەترسییەك.



## ئاست و جۆری یاداوەری خوا

١-یادی خوا کردن لەگەڵ بێ ئاگایی (ئەمە تەنها بە زمانە..)

٢-یادی خوا لەگەڵ بە ئاگایی و هۆشمەندی ئەمە ئامادەبونی دڵە لەگەڵ زماندا و هەست کردنە بەگەورەی خوا.

٣-یادی خوا لەگەڵ تێگەیشتن و لێکدانەوەی.

٤-یادی خوا کردن و دەرچون لە بێ ئاگایی لە غەیری خوا

﴿أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ﴾.

## پێش و دواخستن لە جۆرەکانی یاداوەری خوادا

پێویستە مرۆڤ بەپێی کات و شوێن و بارودۆخ و شیاوی یادەکان، یادی خوا بکات.

١-قورئان خوێندن بە گشتی باشترە لە یادی خوا (ذکر)گەر زانیت ملکەچیت (خشوع) زیاد دەکات.

٢-یادی خوا (ذکرالله) باشترە لە پاڕانەوەو نزا (الدعاء).



٣-ئەو یادی (خوا)یەی کە تایبەتە بــە بارێکـەوە باشــترە لــە خوێندنی قورئان.

- ((لەکاتی رکوع و سجوددا تەسبیحات چاکترەو باشترە لە خوێندنی قورئان (بەڵکو نابێت قورئان بخوێنرێت)، چونکە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە)).
- لەکاتی هەستانەوەدا لە رکوع (سمع الله لمن حمد-ربنا لك الحمد) باشترە لە قورئان خوێندن.
- لەکاتی دانیشتندا لــە نوێـژ بـۆ (تـشهد)، ئـەوا (تـشهد) چاکترە لە قورئان خوێندن و تسبیحات.
- سورەتی (الاخلاص) (قل هو الله) هەرچەندە بەها و بەرزی بەرامبەرە بە یەك لەســەر ســێی قورئــان، بــەڵام لــەکات و شوێنی خۆیدا ناگاتە ئایـەتی (المواریـث) یـا (الطـلاق) یـا (الخلع). هەرکاتێ پێویست بکات، ئەم ئایەتانـە بەسـود و باشترن لە خوێندنی سورەتی (الإخلاص).



- لەکاتی سەلام دانەوەدا لە نوێژ و دوای نوێـژ (تـسبيحات) (سـبحان والحمدلله، الله اكبر، لا إله إلا الله) باشترە لەقورئان خوێندن.
- لەکاتی بانگ داندا وەڵام دانەوەو ووتـەوەی بانگەکـەو (اللـهم رب هـذه..) باشـترە لـە قورئـان خوێنـدن و تسبيحات.. (واتە کاتێ قورئانت دەخوێند یا یادی خـوات دەکرد بانگی فەرموو ئەوا وەڵامی بانگەکە بدەیتەوەو پاشان اللهم رب.. بخوێنیێ خێرترو باشترە) واتە ئەبێ بزانین هەموو بارێ شتێکی تیا ئەوترێ.
- لەدوای سەلامدانەوەی نوێژ ٣٣جار تسبيحات و الحمد.. باشترە لە قورئان خوێندن.
- کاتێ نان دەخورێ (بسم الله) بکرێ باشترە لە قورئان خوێندن.
- کاتێ ڕائەپەڕی لە خەوێکی ناخۆش (أعوذ بالله) باشترە لە قورئان خوێندن.
- کاتێ توڕەئەبی (أعوذ بالله) باشترە لە یادی خواو قورئان خوێندن.



٤-لەکاتی یادکردنـەوەی تـاوان و گوناهـەکان یـان داوای لێخۆشبوون کردن لەکارو ووتەیەك کە کردوتە یان ترسـان لەوەی کە توشی شتێك بیت لەلایـەن شـەیتانەکانی مـرۆڤ و جنۆکەوە ئەوا یادی خواو داوای لێخۆشبوون و نزاو پاڕانەوە باشترە بۆت لە قورئان خوێندن و تسبیحات.

٥-کاتێ مرۆڤ داواکاری هەیە لەوەی خوای گەورە کارێکی بۆ برەخسێنێ یـا لەبەلایـەك دووری بخاتـەوە ئـەوا دلـّی پـڕ لەجۆشەو پاڕانەوەو دوعاکەی باشترە لە خوێندنی قورئان یان یادی خوا وەك تەسبیحات.

## پاڕانەوەو نزاکردن "الدعـــــاء"

بریتـی یـە لــە زمـانی خۆدەرخـستن لەوپـەڕی ملکەچـی و نیازمەندی بە خوا. جۆرەکانی:-

١-پاڕانەوەی پەرستن(دعاء العبادة): بریتییـە لەباسـکردن و پیاهەڵدان بەخوای گەورەدا بـەوەی خـۆی بـاس و وەصـفی خۆی کردووەو پێغەمبەر ﷺ فەرمویـەتی بەشـێوەی تـرس و داواو دڵنیایی (الخوف والرجاء).

٢-پاڕانەوەی پێویستیەکانی مرۆڤ(دعاء المسألة):

أ-داواکردنی هەموو ئەو شتانەی سودمەندی ژیـانی مـرۆڤن (جلب المنفعة).

ب-داواکردنی لابردنی ئەو شتانەی کە زیانمەندن بە مرۆڤ لە ژیاندا (دفع المضرة)(بۆدنیاوئاخرەت).





## ئەو ئایەتانەی پشتگیری لە دوعاکردن دەکەن

١-﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴾.[1]

٢-﴿ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴾.[2]

٣-﴿ فَٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾.[3]

٤-﴿ وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ﴾.[4]

٥-﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ ﴾.[5]

٦-﴿ قُلْ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ تَدْعُونَهُۥ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً لَّئِنْ أَنجَىٰنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴾.[6]

---

١ غافر ٦٠

٢ الاعراف ٥٥

٣ غافر ١٤

٤ الأعراف ١٨٠

٥ النمل ٦٢

٦ الأنعام ٦٣

## هەندێ لەو فەرموودانەی باسی پارانەوە دەکەن

١ -((الدُّعاءُ هو العبادة)).[1]

٢ -((ليس شيءٌ أكرم على الله تعالى مِن الدُّعاء)).[2]

٣ -((لايُرَدُّ القَدَرَ إلا الدُّعاء..)).[3]

٤ -((إن ربَّكُمْ حَيٌّ كريم يَستحي من عَبْدِهِ إذا رفَعَ يَدَيْهِ إليه بِدَعْوَةٍ أنْ يَرُدَّهُمَا صِفراً ليس فيهما شيءٌ)).[4]

٥ -((عن ابى هريرة مرفوعاً (من لم يدع الله يغضب عليه))).[5]

---

١ صحيح أبوداود والترمذي

٢ الترمذي حسن الغريب بخارى في الأدب المفرد

٣ الترمذي صحيح ابن ماجه احمد-صححه الألباني ٢٣٦

٤ الترمذي-ابن ماجه ابوداود في صحيحه. صححه الألباني ٩٧

٥ الصحيحة ٢٦٥٤





## مەرج و پێداویستیەکانی گیرابوونی دوعا

١-دورر بورن لە حەرام خواردن لە خۆراك و پۆشاك و...هتد

﴿فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي﴾.[1]

٢-دوعاكە بۆتاوانكردن و بچڕاندنی خزمایەتی نەبێت.

(ما على الأرض مسلم يدعو الله بدعوة إلا آتـاه الله اياهـا أو صرف عنهُ من السوء مِثلِها، مالم يدع بإثم او قطعة الرَّحم).[2]

٣-دڵسۆزیی (ئیخلاص).

٤-بێ ئاگانەبوونی دڵ لەكاتی دوعاكاندا.

((أن الله لا يستجيب دُعَاءً من قلب غافِلٍ لاه)).[3]

٥-جەختكردنەوە لە داواكارییەكان لەكاتی دوعاكردندا.

((إذا دعا أحَدُكُمُ فَلْيَعْزِمِ المسألة ولا يقولَنَّ اللهم إن شئت فأعطيني..)).[4]

---

١ البقرة/ ١٨٦

٢ الترمذي حسن صحيح مخزومي بخاري

٣ الترمذي-أحمد صححة ألباني

٤ بخاري



٦-زیادەڕەوی (تعداد و عدوان) نەکردن لە پاڕانەوەو دوعادا.

٧-زۆر دوعاکردن ((إذا نكثرُ قال: الله اكْثَرُ)).[١]

٨-پەلەنەکردن لە گیرابوونی داواکە.

((یستجابُ لأحدكُم مالَم یعمَل یَقُولُ: دَعوت فلم یستجب لی )).[٢]

٩-دڵنیابوون لە گیرابوونی داواکەت.

((ادعوا الله وأنتم موقِنون بالإجابة..)).[٣]

## تایبەتمەندی پاڕانەوەی وەرگیراو

١-ئامادەیی دڵ (واعلموا أن الله لایستجیب دُعاء مِن قلب غافلٍ لاه).[٤]

٢-خرۆشانی دڵ لەکاتی داواکاریەکەدا بە زمان.

٣-ڕەچاوکردنی شوێنە گونجاوو تایبەتەکانی وەرگیرانی دوعا.

---

١ ترمذی وحسن مخرج الطبرانی

٢ بخاری و مسلم

٣ الترمذي وصححه الألباني و أحمد

٤ الترمذي-صحيحة ٥٩٤

٤-لەوبارە گونجاوانەدابێ کە دوعای تیادا وەردەگیرێ (وەك کاتی سوجدە..)، (وأما السجُودُ فاجتهدوا فيه فی الدُعاء فَقِمنٌ أن يُستَجَابَ لكم).[١]

٥-دوعاکردن بەوشێوەیەی لە قورئان و فەرموودەکاندا هاتووە (مأثور) بێت.

٦-بوونی خشوع و دەرخستنی نیازمەندی (محتاج)ی بە خوا بە دوور لە خۆبەگەورەدانان.

٧-ڕوو لە ڕووگە (قبلە) کردن.

٨-دەست بە دەستنوێژ بوون.

٩-دەست بەرزکردنەوە (إن ربَكُم حَيٌ كريم يستحي من عبده إذا رفع يديه إليه أن يَرُدَّهُما صِفراً ليس فيهما شيء).[٢]

١٠-بە سوپاس و ستایش دەست پێ بکرێ (الحمدلله).

((...وسمع رسول الله رجُلاً يُصلي فمجَد الله وحِمَدَهُ وصلى على النبي فقال رسول الله (ادعُ تُجَب وسَلْ تُعْطَ))).[٣]

---

١ رواه مسلم.

٢ الترمذي-ابوداود-ابن ماجة-الباني حديث صحيح (٩٧)

٣ صحيح أبوداود والنسائي و صحيحة.

١١-پاشان صلاوات لەسەر پێغەمبەرﷺ بدرێ.
١٢-پێش ئەوەی داواکە بکرێت داوای لێخۆش بوون (استغفرالله) کردن و پەشیمانی دەرخستن.
١٣-پێداگری و دووبارەکردنەوەی داواکە (إذا دعا أحدُكُمْ فَليعزِمِ المَسألَة).[1]
١٤-بەترس و داواو دڵنیایی (خوف و رجاء)ەوە دوعاکردن.
١٥-پەناگرتن و داواکردن بەناوو سیفاتە جوان و بەرزەکانی بەشێوەیەکی یەکتاپەرستانە.
١٦-چاکەو خێرکردن (صدقە) پێش پاڕانەوە.
١٧-((بەکارهێنانی دەستەواژەی (یا حي یا قیوم) لەکاتی پێداگری (إلحاح)دا (وإذا إجتهد في الدعاء قال: (يا حيّ يا قيوم))).[2]
١٨-بە (ربٌ)ی دەست پێ بکات چونکە زۆربەی دوعاکان لە قورئاندا (پێغەمبەران) کردویانە بە (ربٌ) دەست پێ دەکات.

١ بخاري.
٢ الترمذي

١٩-پێش دوعا كردنەكە (دە جار (سبحان الله)، دە جار (الحمدلله)، دەجار (الله اكبر) ووتن.

(سبحي الله عشراً، واحمديه عشراً، وكبريه عشراً، ثم سليه حاجتَكِ يَقُل (نعم، نعم)).[1]

٢٠-لەداواكاندا سەرەتا بۆخۆت داوا بكەيت و پاشان بۆ ئەوانی تر.

(كان اذا ذكر احداً فدعى له بدأ بنفسه).[2]

## سنوور بەزاندن لە پاڕانەوەدا

١-هاواركردن و قيژاندن.

٢-پاڕانەوە لە پەروەردگار و داواكاری پلەو پايەی تايبەتی پێغەمبەران لەدونيا و دوارۆژدا.

٣-پاڕانەوەو داواكردنی نەگونجاو وەك شەوبێت بلێيت خوايە بيكەيت بە رۆژ ياخود ژيان تاكو قيامەت.

١ النسائي والترمذي الباني حسن الاسناد (٢٧٩)

٢ الترمذي (حسن صحيح)

٤-پاڕانەوە بۆ بەدەستهێنان و دەستکەوتنی شتێك كە تاوان و گوناه و سەرپێچی خوایە.
٥-پاڕانەوە بەشێوەیەك كە لەقورئان و فەرموودەی پێغەمبەردا نەبێت و هەر لە خۆوە دابڕێژرێت.
٦-هاوبەشیکردنی کەس و شتەکان لەگەڵ خوادا بۆ بەدیهێنانی داواکارییەکانت.
٧-پاڕانەوەکەی بە ملکەچی و نیازمەندی دەرخستن بێت.
٨-زیادەڕەوی لەپاڕانەوە بەشێوەی ترس بەجۆرێك کە لەدەسەڵاتدارێکی یاخی داوا بکرێت.
٩-پیاهەڵدانی پەروەردگار بەشێوەیەك کە باسی نەکردووەو ڕازی نەبووە لەسەر پیاهەڵدانی.
١٠-دوعاکردن بە تاوان یا پچڕانی ڕەحم .
((ما على الأرض مسلم يدعوا الله بدعوة إلا أتاهُ الله إياهُ أو صرف عَنهُ مِن السوء مِثلها مالم يدع بإثم أو قطعة الرحم)).[١]

---

١ ترمذی و البخاری في ادب المفرد

## پارانەوە (بە نهێنی و شاراوەیی)

﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ﴾.[١]

١-ئەو کەسەی ئەپاڕێتەوە بڕوای بەوەبێت کە خوا گوێبیستیەتی چەند بە نهێنی بیکات.

٢-نهێنی بوونی پاڕانەوەی مرۆڤ مانای ئەدەبە لەبەرامبەر گەورەیی پەروەردگاردا.

٣-ئیخلاصی زیاتر تیایە.

٤-نزاو پاڕانەوەکە بۆ دڵ و دەروون باشترە، هەروەها ملکەچی و بەندایەتی زیاتر تێدایە.

٥-بەڵگەیە لە نزیکی دوعا خوێن لە خواوە، کە خوا دوور نی یە لیّ ی تاکو دەنگی پیّ ی نەگات.

٦-دورە لەچاوی چاو چنۆك و بەدی هێنانی نیعمەتیّ کەداوای دەکات.

---

١ الأعراف ٢٠٥

## کاتەکانی گیرابوونی دوعا

١-کاتی بانگ.

٢-لەنێوان بانگدان و ئیقامەکردندا بۆ نوێژی جەماعەت.

((الدُّعاءُ لا يُرَدُّ بين الآذانِ والإقامةِ)) .[١]

٣-ناوەڕاست و نیوەی شەو (دوای نیوەی شەو).

((أقربُ مايكونُ الرَّبُ مِن العبدِ في جوف الليل الآخر.)).[٢]

٤-رۆژی هەینی (دوای نوێژی عەسر، هەتا نزیك خۆرئاوابوون).

((إن في الجُمعةِ لساعةً لا يوافِقُها مُسلمٌ يسألُ الله فيها خيراً إلا أعطاه إياهُ)).[٣]

٥-ڕۆژگیران و مانگ گیران.

((إن الشمس والقمر من آيات الله... فإذا رأيتموهما فكبروا وادعوا الله وصلّوا وتصدقُوا)).[٤]

---

١ صحيح أبوداود. النسائي الترمذي واحمد

٢ الترمذي-النسائي-الطبراني صححه الألباني

٣ بخاري و مسلم

٤ بخاري و مسلم

٦-لەکاتی خۆشی و ئاساییدا (زۆر دوعاکردن).

((من سَرَّهُ أن يُستجَابَ لَهُ عِنْدَ الكَرْبِ والشدائِد فلْيُكْثِرْ مِن الدُّعَاءِ فِي الرَّخَاءِ)).[1]

٧-بارە ناهەموار و سەختەکانی ژیان وەك نەخۆشی و تاقیکردنەوەکانی پەروەردگار لە نموونەی دوعاکەی حەزرەتی یونس (علیه السلام).

((دعوة ذى النون إذا دعا وهو في بطن الحوت لا إله إلا أنت سبحانك..) فإنه لم يدع بها رجل مسلم في شئ قط إلا استجاب الله لَهُ)).[2]

٨-لەکاتی (قووقە) خوێندنی کەڵەشێر لەشەودا.

((إذا سمِعتُمْ صياح الديكة فاسألوا الله من فَضْلِهِ، فإنها رأت مَلَكاً...)).[3]

٩-دوای سەلام دانەوە لەنوێژدا.

((لا تدعنّ في دُبر كل صلاة تقول: اللّهم أعني على ذكرك وشكرك وحسن عِبادتك)).[4]

---

١ الطبراني-والحاكم في مستدل صحيح اسناد ووافقه الذهبي اسناده حسن

٢ الترمذي والحاكم الطبراني اسناد حسن

٣ بخاري و مسلم

٤ صحيح ابو داود





١٠-لەكاتی دەست بەرزكردنەوەدا.

((إن ربَكُم حيٌ كريم يستحي من عبده إذا رَفَعَ يديه إليه بدعْوَةٍ أن يَرُدَّهُما صِفْراً ليس فيها شيءٌ)).[1]

١١-شەوی پازدەی شەعبان.

((في ليلة نصف من شعبان يغفر الله لأهل الأرض الاّ لمن اشركَ أو مشاحن)).[2]

١٢-مانگی ڕەمەزان.

((إن الله في كل يوم وليلة عتقاءمن النار في شهر رمضان، وإن لكل مسلم دعوة يدعو بها فيستجاب له)).[3]

١٣-ليلة القدر.

١٤-ڕۆژی عەرەفە. (أفضل الدعاء دعاء يوم عرفة).[4]

---

١ ابوداود صحيحه الترمذي-ابن ماجه صححه الألباني

٢ جامع الصحيح

٣ ابن ماجة صحيح-البزار-قال الهيثمي مجمع زوائد صحيح

٤ الترمذي صححه مالك في موطا

١٥-ڕۆژی جەژن (کاتی خوتبەو نوێژی جەژن).

(فليشهدوا دعاء المسلمون...).[1]

١٦-شەوی هەینی.

١٧-کاتی تێك ڕژاندنی سوپای ئیسلام و کافران.

((اثنان لا تردان: الدعاء عند النداء وعند البأس حيث يلتحم بعضهم بعضاً)).[2]

١٨-لەکاتی باران بارینداا (نزول الغيث).

((اطلبوا استجابة الدعاء... ونزول الغيث)).[3]

١٩-دە (١٠) ڕۆژی ذی الحجة.

((ما من أيامٍ أفضل عند الله من أيام عشر ذي الحجة)).[4]

---

١ بخاري

٢ صحيح ابوداود الموطأ مالك

٣ سلسلة الصحيحة١٤٦٩

٤ صحيح ابن حبان و هو في صحيح مسلم

## ئەو شوێنانەی کە دوعای تیا گیرا ئەبێت

١-لەکاتی سوجدەبردندا.

((أقرب مایکون العبد من ربه وهو ساجدٌ فأكثِروا الدُّعاء)).[1]

٢-دوای خوێندنی تحیات لە نوێژدا پێش سەلامدانەوە.

((وَلكن قُولُوا: التحياتُ لله و..... ثُمّ يَتَخَيَّرُ مِنَ الدُّعاءِ أعجَبَهُ إليه فيدعُو)).[2]

٣-لەجێگای خەودا بەدەستنوێژەوە.

((من آوى إلى فِراشِهِ طاهِراً يذكُرُ الله حتى يُدْرِكَهُ النُّعَاسُ لم يَتقلَّبْ ساعَة مِن الليل سأل الله مِن خير الدُّنيا والآخِرةِ إلا أعطاهُ إياهُ)).[3]

١ رواه مسلم

٢ بخاري و مسلم

٣ الترمذي وحسن صحيح

٤-لە کێوی (عەرەفە)دا.

((من يوم عرفة ينزله الله الى السماء الدنيا فيُباهى بأهل الأرض أهلَ السماء فيقول: انظروا الى عبادى جاءوا شعثاً غُبراً حاجين....)).[١]

((أفضل الدعاء دُعاء يوم عرفة...)).[٢]

## ئەوکەسانەی کە دوعایان گیرا ئەبێت

١-موسڵمان بۆ موسڵمان بەشێوەی نهێنی.

((دعوَةُ المرء المُسلِم لأخيه بِظَهر الغيبِ مُستجابةٌ..)).[٣]

٢-ئەوکەسەی چاکە لەگەڵ دایکیدا.

((فقال عمر: إن رسول الله ﷺ قال ان رجُلاً يأتيكم مِن اليمن يُقال لَهُ أويسٌ، لا يَدَعُ باليَمَنِ غَيْرَ أُمٍ لَهُ... فمن لقَيهُ مِنكُمْ فليَستغْفِرْ لَكُمْ)).[٤]

---

١ صحيح ابن حبان

٢ الترمذى وصححه مالك في موطأ

٣ رواه مسلم

٤ رواه مسلم

٣-پاڕانەوەی ستەم لێکراو.

((دعوة المظلوم فإنَّهُ ليسَ بينها وبينَ اللهِ حِجابٌ)). [١]

٤-کەسێك پێشتر کارێکی چاکەی لە ئیخلاصەوە کردبێت پاشان داوابکات لە بەهانەی ئەو چاکەیەوە.

((سێ کەس لە ئەشکەوتێکدائەبن و بەردێك دەمی ئەشکەوتەکە ئەگرێ و ئەوان ئەپاڕێنەوەلە خوا بەم کردارانە هەتا رزگاریان بێ:-

- چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك دا.
- دانەوەی مافی خەڵکی بەزیادەوە.
- نەکردنی تاوان و سەرپێچی لە ترسی خوا)). [٢]

٥-باوك ((ثلاث دعواتٍ مُستجابات لاتنساكَ فيهنَّ دعوَةُ الوالد..)) [٣]

٦-ڕێبوار (مسافر) (ثلاث دعوات.... ودعوة المسافِر...) [٤]

---

١ بخاری و مسلم

٢ صحيح بخاری و مسلم

٣ ابوداود وابن ماجه و حسن الألبانی

٤ ابوداود وابن ماجه و حسن الألبانی

٧-ڕۆژوەوان هەتا ڕۆژو نەشکێنێ.[١]

٨-سەرکردەیەکی دادپەروەر.

((ثلاثــة لا تُــرَدُّ دعــوَتهُم: الــصائِمُ حَتــى يَفطِــر والإمــام العادل..)).[٢]

٩-ئەوکەسەی یادی خوا زۆر ئەکات.

(ثلاث لا يُرَدُّ دُعاؤهُمْ: الذَّاكِرُ اللهَ كثيراً...).[٣]

١٠-دوعای کوڕ یا کچ بۆ دایك و باوکی.

((إن الله تبارك وتعالى ليرفع للرجل الدرجة، فيقــول، أنــى لى هذه؟ فيقولُ: بدعاء ولدك لك)).[٤]

---

١ صحيح ابوداود والترمذي حسنه.

٢ الترمذى-ابن ماجه والطبراني باسناد حسن.

٣ صحيح جامع ٢ ٧٢ الالبانى.

٤ (رواه البزار (مجمع الزوائد) صحيح قال الهيثمي ١٧٢٤٠

## نموونەیەکی قورئانی لە دوعای وەرگیراو

### پاڕانەوەی ئەیوب (علیه السلام)

﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾.[1]

**لەم پاڕانەوەدا ئەبینین کە ئەم پێغەمبەرە:-**

١-یەکتاپەرستی و تاك و تەنهایی خوا بەدیار دەخات.

٢-دەرخستنی لاوازی و هەژاری خۆی .

٣-بوون و چێژی خۆشەویستی بۆ خوا کە پێویستی هەمیشەیی دەردەخات.

٤-دان نان بە سیفاتی میهرەبانی خوا بەشێوەیەك کە لە هەموو میهرەبانەکان میهرەبانترە.

٥-پەنابردن و پاڕانەوە بەناوو سیفاتەکانی پەروەردگار.

٦-دەرخستنی نیازمەندی ئەیوب وەك پێغەمبەرێك بە پەروەردگار.

---

[1] الأنبياء (٨٣)



## ئەو دوعایانەی پێغەمبەر ﷺ بۆکەسانی تری کردووە

پێغەمبەر ﷺ هەمیشە دوعای بۆ هاوەڵەکانی بەپێ ی ناست و پێویستیان بەو دوعایە دەکرد، کە دروستە موسوڵمانیش هەمان سوننەت جێ بەجێ بکات لەوانە:

١-دوعاکردن بۆمردوو (لەنوێژی مردوودا):

ئەم دوعایە تایبەتە بە مردووەوە کە ئەوکەسەی نوێژی لەسەر ئەکات دەیخوێنێت.

((أللّهم اغْفِر لَهُ وَارْحَمهُ، وَعافِهِ وَاعفُ عَنْهُ، وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ، وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ، وَاغسِلْهُ بِالماءِ والثَّلِج والبَرْدِ، وَنقِّهِ مِنَ الخَطايا كَما نَقَّيتَ الثَّوبَ الأبيضَ مِنَ الدَّنَسِ وَأَبْدِلْهُ داراً خَيراً مِن دارِهِ، وَأَهْلاً خَيْراً مِن أَهْلِهِ وزوجاً خيراً مِن زَوجِهِ، وأَدخلْهُ الجَنَّةَ وَأَعِذهُ مِنْ عَذابِ القَبْرِ (أَو مِنْ عَذابِ النَّار) )).[1]

٢-دوعاکردن بۆکەسی زیندوو باری ژیانی باش بێت.

(أَللّهمَّ أَكثِر مَالَهُ وَوَلَدَهُ، وَبَارِكْ لَهُ فيما أعْطَيْتَهُ). [2]

---

١ رواه مسلم

٢ رواه البخاري و مسلم

## صلاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ ءَامَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾.[1]

صلاوات دانی مرۆڤەکان واتـە: داواکـردن لـەخوا کـە پیـا هەلّبدات(ثناء)ی بکات وە پلەو پایەی بەرز بکاتەوە و نزیکی بکاتـەوە لـەخۆی، وە داوا دەکـەین کـە خـوا ئـەو پلـەو پایەی(الوسيلة)ی بداتیّ.

١- باس کردن و پیاهەلّدان بەسەر پێغەمبەردا ﷺ وە دەرخستنی رِێز و چاکەو شەرەفی واتە (پلەو پایەی پێغەمبەر ﷺ).

٢-صلاوات دانی مرۆڤ بۆسەر پێغەمبەر ﷺ لەقازانجی صلاوات دەرەکەدایە، چونکە پاداشت وەردەگرێـت وە فرمـانێکی خـوا بەجیّ ئەهێنێت و بەر شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ ئەکەوێت.

---

[1] الاحزاب (٥٦)

## ئەو شوێنانەی صلاواتیان تیا ئەدرێ

١-شەوو ڕۆژی جومعە ((اكثر والصلاة عَلَيَّ يوم الجمعة وليلة الجمعة، فمن صلى عليّ صلاة صلى الله عليها بها عشراً)).[1]

٢-لەکۆتایی خوێندنی تحیيات لە نوێژدا.[2]

٣-لە نوێژی مردوودا.[3]

٤-لە خوتبەی هەینی و جەژنەکان و مانگ گیران.

٥-دوای بانگ.

((إذا سمعتم المؤَذِّن فقولوا مثل مايقول ثمّ صلّوا عليّ فإنّه من صلى علي صلاة صلى الله عليه بها عشراً)).[4]

---

١ سلسلة الصحيحة١٤٠٧

٢ رواه البخاري و مسلم

٣ رواه البخاري و مسلم

٤ رواه مسلم



٦-لەکاتی پاڕانەوەدا.

((سمع رسول الله ﷺ رجلاً يدعوا في صلاته فلم يصلِّ على النبي فقال النبي (عَجِلَ هذا) ثم دعاه فقال (إذا صلى أحدكم فليبدأ بتحميد الله والثناء عليه ثم ليصَلِ على النبي ثم ليدع بعد بماشاء)).[1]

٧-لەکاتی چوون و هاتنە دەر لە مزگەوت.

٨-((لەکاتی صفاو مەروەدا لە حەج یان عەمرە)).[2]

٩-لەکاتی کۆمەڵ بوونی کۆڕ و کۆمەڵێك.

((ما إجتمع قوم ثم تفرقوا عن غير ذكرالله، وصلاة على النبي إلا قاموا على أنتَنَّ من جيفة)).[3]

١٠-((لەکاتی باس کردن و ناوهێنانی پێغەمبەردا ﷺ)).[4]

١١-لەکاتی بەیانیان و دوای عەسران.

((من صلّى عليَّ حين يصبح و حين يمسى عشراً أدركته شفاعتي يوم القيامة)).[5]

---

١ صحيح أبوداود صحيح النسائي

٢ ابوداود ابن ماجة الترمذي قال حديث حسن

٣ جامع صحيح (٥٨٢)

٤ الترمذي وقال حسن صحيح

٥ جامع الصغير (٦٢٣٣)






# یاد و دوعای
# بارە جیاوازەکان




## دوعای دەرچوون لەماڵ

لەکاتی لەماڵ دەرچوون دا بگوترێ:

١-(بسم الله ، توكلت على الله ، لاحول ولا قوة الا بالله).

گەر کەسێك ئەمانەی بەتەواوی ووت و لەدڵیا چەسپی بەدڵنیایەوە پێی ئەوترێ:

- بەستە خوا کە پشتی پیّ ببەستی.
- پارێزراوی.
- ڕێ نمونی کراوی.
- شەیتان ڕێگات بۆچۆڵ دەکات و لەسەر ڕێگات ناوەستی ویڵت بکات.

(من قال يعني إذا خرج من بيته بسم الله توكلت على الله لاحول ولا قوة الا بالله. يقال له كفيت ووقيت وهديت وتنحى عنه الشيطان..).[١]

٢-ووتنی: (اللهم إني أعوذ بك ان أَضِلَّ أَو أُضَلّ، أو أَزِلَّ أَو أُزَل أَو أَظْلِمَ اَو أُظْلَم، أَو أَجْهَلَ أَو يُجْهَلُ عَلَيَّ)[٢].

---

١ صحيح ابوداود والترمذي حسنه صحيحه

٢ ابوداود والترمذي وحسنه قال حسن صحيح





## دوعای چونه بازار

(لا اله الا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير).

دەبێته هۆی بەدەست هێنان و نوسینی یەك ملیۆن چاكەو وە یەك ملیۆن خراپەشی لەكۆڵ نەبێتەوە.

(من دخل السوقق من الأسواق فقال: لا اله الا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير. كُتب له ألف ألف حسنة ومحا عنه ألف ألف سيئة).[1]

## دوعای گەڕانەوە بۆ ماڵ

لەكاتی چوونە ماڵەوەدا:

- ووتنی: (بسم الله ولجنا وبسم الله خرجنا وعلى ربنا توكلنا)، پاشان سەلام كردن لە ماڵ و منداڵ

(بسم الله ولجنا وبسم الله خرجنا وعلى ربنا توكلنا، ثم ليسلم على أهله).[2]

---

1 الصحيحة ٣١٣٩.

2 صحيح أبوداود: ٢٢٥

● وتنی: بسم الله كاتی چوونه ماڵەوه وه هەروەها لەكاتی نـان خواردن، دەبێته هۆی نەهێشتنی هاتنه ژوورەوەی شەیتان.

(إذا دخل الرجل بيته فذكر الله تعالى عند دخوله وعند طعامه، قال الشيطان: لا مبيت لكم ولا عشاء وإذا دخل فلـم يـذكر الله تعالى عند دخوله قال الشيطان: أدركتم المبيت وإذا لم يذكر الله تعالى عند طعامه قال أدركتم المبيت والعشاء).[1]

## نەهێشتنی هاتنه ژوورەوەی شەیتان بۆ ماڵ

١-خوێندنەوەی سورەتی (البقرة): ماڵێك سورەتی (البقرة)ی تێدا بخوێنرێت شەیتان ڕوی تیّ ناكات.

(اقرأ سورة البقرة في بيوتكم فإن الشيطان لايدخل بيتاً يقرأ فيه سورة البقرة).[2]

٢-كردنی نوێژ لەماڵدا.

(لا تتخذوا بيوتكم مقابر صلوا فيها..).[3]

---

١ رواه مسلم

٢ سلسلة الصحيحة ١٥٢١

٣ رواه مسلم

## (کەفارەتی کۆڕ و کۆمەڵ)

لەکاتی هەستان لەکۆڕ و دانیشتنێك کە کەم یادی خوای تێدا کرابوو، قسەی نابەجێ و نارەواشی تێداکرابوو ئەم زیکرە ئەخوێنرێت بەمەبەستی کەفارەتی گوناهەکانی.

(سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا اله الا انت استغفرك وأتوب اليك).

(من جلس من مجلس فكثر فيه لغطة فقال قبل ان تقوم (سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا اله الا أنت استغفرك وأتوب اليك إلا غفر له ماكان في مجلسه ذلك).[1]

## (بینینی شتێکی دڵخۆشکەر لەڕێگادا)

ووتنی: (الحمد لله الذي بنعمته تتمُ الصالحات).

(إذا رأى ما يحبّه قال: الحمد لله الذي بنعمته تتمُ الصالحات).[2]

---

١ رواه الترمذي وقال حسن صحيح

٢ صحيح ابن ماجه والحاكم



## بیستنی هەواڵێکی دڵخۆشکەر

وتنی: (الحمدلله) و (الله اکبر).

(ثم قال والذي نفسي بيده، إني لأطمع أن تكونوا ثُلثُ أهل الجنة، قال حمدنا وكبرنا).[1]

## بینینی شتێکی ناخۆش

وتنی: (الحمدلله على كل حال).

(إذا رأى ما يكره قال: الحمدلله على كل حال).[2]

## بینینی سەرسورهێنەرێك

وتنی (بارك الله)، چاوچنۆك و حەسود نەبوون بەرامبەر ئەو شتە.

(إذا رأى احدكم ما يعجبه في نفسه فليبرك عليه فإن العين حق).[3]

١ رواه البخاري و مسلم

٢ صحيح ابن ماجه.

٣ رواه احمد وصححه الألباني من كلم الطيب (١٨٥).



## دوعای بینینی کەسێك توشی بەڵاو ناخۆشی و نەخۆشیەك بووە

وورتنی: (الحمدلله الذي عافاني مما أبتلاك وفضلني على كثير ممن خلق تفضيلاً)

خوێندنی ئەم دوعایە سوپاس و ستایش کردنەو هەست کردنە بە نیعمەتی زۆری خوایی کە پێدراوەو سوپاسی بکات.

ئەو کەسەی ئەو دوعایە بخوێنێ خوای گەورە لەو بەڵاو نەخۆشی یە ئەیپارێزێ.

(من رأى صاحب بلاء فقال: الحمدلله الذي عافاني مما أبتلاك وفضلني على كثير ممن خلق تفضيلاً، لم يصبه ذلك البلاء).[1]

## دوعای تاقیکردنەوە بە بەڵاو مردن و موصیبەت

- وورتنی: (إنا لله وإنا اليه راجعون).
- وورتنی: (اللهم أجرني في مصيبتي واخلف لي خيراً منها).

(ما من عبدٍ تصبه مصيبة فيقول: إنا لله وإنا اليه راجعون، اللهم أجرني في مصيبتي واخلف لي خيراً منها).[2]

---

١ رواه الترمذي وقال حسن غريب وابن ماجه. قال الألباني صحيح لغيره

٢ رواه مسلم

## دوعای پەناگرتن لە ستەمکار

١-(اللهم إنا نجعلك في نحورهم ونعوذ بك من شرورهم).[1]

٢-(حسبنا الله ونعم الوكيل).[2]

## تەوبە لە تاوان و گوناه

بۆئەوەی تەوبە لە تاوان و گوناه بکرێت کاتێك لەنێوان بەندەو خوادابێت ئەوا:

١-دەست نوێژ گرتن.

٢-کردنی دوو ڕکات نوێژ.

٣-تەوبەو (استغفرالله) کردن لەسەر ئەو تاوانەی کە کراوە، دەبێتە مایەی لێخۆشبوونی خوا.

((ما من عبدٍ يُذنب ذنباً ثمّ يتوضّأ، ثم يُصلّي ركعتين ثمّ يستغفر الله لِذلك الذنب إلا غفر الله)).[3]

---

١ ابوداود والنسائي

٢ بخاري

٣ ابوداود ابن ماجه والترمذي احمد في مسنده

## پاك بوونەوە لە (گوناه)و تاوانە بچوكەكان

گوناه و تاوانە (بچوكەكان) لە مرۆڤ ئەبێتەوە هەروەك گەڵا ڕێزان بەووتنی: (سبحان الله و الحمدلله ولا إله الا الله والله أكبر).

(إن سبحان الله و الحمدلله ولا إله الا الله والله أكبر تنفضُ الخطايا كما تنفضُ الشجرة ورقها).[1]

## رزگاربوون لەناخۆشی و گرفتەكان

١-ووتنی: (لا اله الاّ الله العظيم الحليم، لا إله الاّ الله ربّ العرش العظيم، لا اله إلاّ الله رب السماوات وربّ الأرض و ربّ العرش الكريم).[2]

---

١ سلسلة الصحيحة ٣١٦٨

٢ رواه مسلم

٢–خوێندنی ئەم ئایەتە بەشێوەی نزاو پاڕانەوە.

﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾.[١]

(الا أخبركم بشيء إذا نزل برجل منكم كرب أو بلاء من بلايا الدنيا دعا يُفرج عنه؟) دُعاء ذي النون (لا اله الا انت سبحانك اني كنت من الظالمين).[٢]

## دوعای خەفەت و تەنگانەکانی ژیان

١–پابەندبوون بە (أستغفرالله) چارەسەرە بۆ کێشەو تەنگ و چەڵەمەو کرانەوەی گرێکان و ڕۆزیدانی بەشێوەیەك کە ژماردن و پێشبینی بۆ نەکراوە.

(من لزمِ الإستغفار جعلَ الله له من كلّ ضيقٍ مخرجاً ومن كلّ همٍ فرجاً ورزقَهُ من حيث لا يحتسب).[٣]

---

١ الأنبياء. ٨٧

٢ سلسلة (الصحيحة) ١٧٤٤

٣ ابوداود و احمد سند صحيح. تحقيق محمد شاكر ابن ماجه

٢–ووتنی: (اللهم اني عبد وابن عبدك وابـن أمتـك، ناصـيتي بيدك ماض في حكمك عدل في قضاؤك، أسألك بكل إسم هـو لك سميت به نفسك، أو علمته أحداً من خلقـك، أو أنزلتـه في كتابك، أو أستأثرت به في علم الغيب عندك أن تجعـل القـرآن ربيع قلبـي ونور صدري وجلاء حزني، وذهابَ همّي).
ما أصاب احداً قط همّ ولا حزن فقال: (اللهم اني عبد وابـن عبدك وابن أمتك...وذهابَ همّي) إلا ذهب الله همـه وحزنـه وابدله مكانه فرحاً..[1]

٣– صلاوات دان لەسەر پێغەمبەرﷺ (اللهم صلى على محمد وعلى آله وسلم...) ئەبێتـە هـۆی ڕەواندنـەوەی خەفـەت و پەژارەی دونیا وە لێخۆش بوونی ئاخیرەت. (أرأيت ان جعلتُ صلاتي كلها عليك) قال (إذن يكفيك الله تبـارك و تعـالى مـا أهمك من دنياك وآخرتك).[2]

---

١ الصحيحة ١٩٩

٢ نسائي طبراني. الترمذي وقال حسن صحيح

## دوعای رزگاربوون له وەسوەسەو دالّغەی خراپی شەیتانی

هەرکاتێ دالّغەو وەسوەسەکانی شەیتان گەشتە سنور بەزاندنی شەرعی خوا ئەوا:

١-بە وتنی: (اعوذ بالله من الشيطان الرجيم) پەنا دەگیرێ بەخوا.

(يأتي الشيطان أحدكم فيقول: من خلق كذا؟ من خلق كذا؟ حتى يقول: من خلق ربّك؟ فإذا بلغهُ فليستعذ بالله ولينته).[1]

٢- وتنی: (لا اله الا الله).

قول صحابي (ماذا ينجينا مما يلقي الشيطان في أنفسنا، فقال ابوبكر: قد سألته عن ذلك فقال: (ينجيكم من ذلك أن تقولوا ما أمرتُ عمّي أن يقوله فلم يقله) يعنى (لا اله الا الله).[2]

---

١ رواه البخاري و مسلم

٢ طرى مسند احمد

## کاتی تووڕەبوون

١-ڕاستەوخۆ ووتنی: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم).

(إني لأعلم كلمة لوقالها لذهب عنه ما يجد لوقال (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم)).[1]

٢-دەرنەبڕینی ڕق و توڕەبوونەکەی و قوتدانەوەی لەبەر ڕەزامەندی خوا.

(ما من جرعة أعظم أجراً عندالله من جرعة غيظ كظمها عَبد ابتغاء وجه الله).[2]

(من كظم غيظا وهو قادر أن ينفذه دعاهُ الله على رؤوس الخلائق، حتى يخيره من الحور العين، يزوجه منها ماشاء).[3]

٣- شاردنەوەوی ڕق و کینەو دەرنەبڕینی، وە بێدەنگ بوونی گەر ووتەیەکی چاکەو باش نەگوترا.

(من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليقل خيراً او ليصمت).

---

١ سلسلة (٣٣٠٣) الصحيحة

٢ ابن ماجه صحيح مجمع الزوائد وقال صحيح الإسناد.

٣ ابوداود صحيحه ألباني.




